

# کورتەی ژیاننامەی پێغەمبەر

## بە هۆنراوە



محسن أحمد مصطفى



نووسینگەی تەفسیر بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوە هەولێر

# کورتەی

# ژیاننامەی پێغەمبەر

## بە هۆنراوە

محسن أحمد مصطفى

بسم الله الرحمن الرحيم


* ناوی کتێب: کورتەی ژیاننامەی پێغەمبەر بە هۆنراوە.

* نووسەر: محسن أحمد مصطفی.

* تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

* ساڵی چاپ: ١٩٩٩ز - ١٤١٩ك .

* چاپی یەکەم

* لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر.

* چاپخانەی ( خەبات )

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان و درودو سڵاو بڕژێ بەسەر باشترین دروستکراوانیدا (محمد)و یارو شوێن کەوتووانی.

برای بەڕێزم (محسن أحمد مصطفى) بە کاری هۆنینەوەی ژیانی پێغەمبەری نازدار هەستاوە، کاتێك چاوم پیادا خشاند و لێی وورد بوومەوە بینیم کورتەی ژیانی پێغەمبەرمانی لە خۆ گرتووە: هەر لە کاتی لە دایك بوونیەوە تا ئەو کاتەی گەیشتەوە بە پەروەردگاری خۆی، هەروەها کورتەیەکی لە جەنگ و سەرکەوتنەکانیو حەج کردنی لە خۆ گرتووە، هەموو ئەمانەش بە دەربڕینێکی کوردی رەسەن و سادەی بە کێشو سەروا دەربڕیوە، ئیدی بە گشتی ئەم هۆنراوەیە شایستەی ئەوەیە لە کۆڕو کۆبوونەوەکانی یادی لە دایك بوونی پێغەمبەرماندا ﷺ بخوێندرێتەوە.

**طیب عبدالله سلێمان**

**پێش نوێژو مامۆستا لە قوتابخانەی ئەهلی**

**لە گوندی بەحرکە**

**١٩٩٥/٨/١٦**

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس بۆ خوای گەورە کە شەرەفمەندی کردین بە ناردنی دواهەمین پێغەمبەر، و بەرۆشنایی هەڵهاتنی لە تاریکایی رزگارمان بوو، و درود و سڵاو برژێ بەسەر ئەو کەسەی خۆریی چاکە خوازی هەردوو جیهانی تەنیوە: گەورەمان محمد ﷺ دواهەمینی پێغەمبەران و هەروەها درود و سڵاو بڕژێ بەسەر کەس و هاوەڵانیدا و ئەوانەی شوێن بەرنامەکەی کەوتوون تا رۆژی دوایی. وپاشان:

برای بەڕێزم ناسراو بە راستگۆیی و وەفا (مەلا محسن أحمد مصطفى) شەرەفداری کردم بەچاوخشاندن بە هۆنراوە کوردیەکەیدا کە لەسەر ژیانی باشترین دروستکراوەکانی خودا ﷺ هۆنیویەتیەوە، پاش خوێندنەوەی بۆم دەرکەوت نووسراوێکی کۆکراوەیە بۆ توێژینەوەی مێژووی پێغەمبەرمان؛ هەر لە لەدایك بوونیەوە تا کۆچ کردنی بۆ شامو بەشداری کردنی لە بنیات نانەوەی کەعبەی پیرۆزدا. هەروەها ئەو رووداوانەشی لە خۆ گرتووە کە لە رۆژگارەکانی ژیانیدا تێیدا ژیاوە، سەبارەت باوەڕی یەکەمین نەوەی ئیسلامی و نارەحەت کردنیان لە لایەن بێ باوەڕو هاوەڵ پەیداکەرانەوە، هەروەها کۆچ کردنی موسڵمانان بۆ حەبەشەو ئەو شتانەی لە ژیانی بەڕێزیدا تووشی هاتووە وەك دەست پێ کردنی سروش و کۆچ کردنی بۆ (طائف)، و باس کردنی شەوڕەویو بڵند بوونەوە (الإسراء والمعراج)، و کۆچ کردن بۆ مەدینەی پڕشنگدار و بەشدار بوونی لە غەزاکاندا، بەدرو ئوحودو خەندەقو حودەیبییەو خەیبەرو کردنەوەی مەککە،ئیدی کۆتایی پەرتووکەکەی بە باس کردنی حەجیماڵئاوایی و وەفات کردنی باس کردووە

كه خودا ويستى وابوو دواى پەيامى پێغەمبەرانى پێ بهێنێ، هەموو ئەمانەش لە پەتووكە باوەڕ پێ كراوەكانى ژيانو بەسەرهاتى پێغەمبەرەوەى وەرگرتووە، وەك (سيرة إبن هشام الأنصاري، فقه السيرة للبوطي، ونور اليقين للخضري، ومع الأنبياء لعفيف طبارة، و ژيانى پێغەمبەر بە زمانى كوردى لە دانانى شێخ محمدى خالّ).

جا لە ڕاستيدا ئەم نووسراوە شايەنى ئەوەيە لە نێوان ڕۆڵەكانى ئيسلامدا بڵاوبكرێتەوەو لە بۆنە ئايينيەكاندا بخوێندرێتەوە، تاوەكو بە هۆيەوە ڕۆشنايى باوەڕ ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواى سەر زەوى بتەنێو ڕاستيەكانى بۆ هەمووان ئاشكرا ببێ، لە هەر كوێيەك بن و هەر چيەك بن.

لە كۆتاييدا داواكارم لە كردگارى بەرزو بە توانا دانەرى ئەم نووسراوە سەركەوتوو بكات لەوەدا كە خوا خۆى پێى خۆشە و پێى ڕازيە، و ئەم نامەيەش بكاتە توێشووى خۆى و دايك و باوكى لە ڕۆژى دواييدا.

لە كۆتاييدا دواهەمين پاڕانەوەمان سوپاسو و ستايش كردنى پەروەردگارى جيهانيان و سڵاو و درووود بڕژێ بەسەر باشترين بەديهاتووەكانى خواى گەورە محمد ﷺ و هەموو نەوەكانيدا!.

**طاهر مەلا عبدالله سلێمان**

**پێش نوێژو مامۆستا لە قوتابخانەى ئەهلى**

**لە گوندى بەحركە**

**٢٢/صفر/١٤١٤هـ ١٠/٨/١٩٩٣ز**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

سوپاس‌و و ستایشی بێ سنووری لە رادە بەدەر، گوتراو بە زمانی فریشتەو کەسانی رەوشت بەرزو راستو رەواو بیرەوەر، هەروا نووسراو بە نوکی خامەی رۆشنبیرانی ریی قورئانو بەهرەوەر، رازاوە بە وشەی جوانی زانایانی حەق پەروەر، بۆ تۆ ئەی خودای تاك و تەنیای خاوەن توانای داهێنەر، هەروا درودی زۆری بێ پایان، ببارێ بەسەر خۆشەویستی خوای بەخشندەو میهرەبان، (محمد المصطفى) رابەرو پێشەوای پەریو ئینسان، هەروا ببارێ بەسەر ئەو پێغەمبەرانەی کەوا رەوانە کراون بۆ رووناکی ریی هەردوو دنیا لە لایەن یەزدان، هەروا لەسەر ئەو یارو یاوەرانەی دریغییان نەکرد لە پشتیوانی لە ئیسلامو ئیمان.

بێگومان مەبەست لە یادکردنەوەی هەر پێشەواو ناودارێك، بۆ لەبەرچاو گرتنی رێبازەکەیەتی، گەورەترین نیعمەتی خوداش بەسەر ئێمەوە رێبازی خۆشەویستمان (محمد)ە، بە چرای ئایینی ئیسلامی پیرۆز، جیهانی رووناك کردەوە، کۆمەڵی ئادەمی رزگار کرد، لە بتو و بتپەرستی و دیلیو شتی پڕو پووچ، دەرگای خواپەرستیو باوەڕو یارمەتیو برایەتیو رەوشت بەرزی کردەوە، تەرازووی دادی هەڵواسی، بناغەی ئاشتی و تەبایی و دەست پاکیو یەکسانیی دامەزراند، فەرمانی بە زانست و وریایی هۆشمەندیو

هیوری‌و بێ گەردی کرد، بۆ هەموو موسڵمانێك جوان‌و ڕەوایە بەرامبەر بەم نیعمەتە، لە ڕۆژو مانگی لە دایك بوونی ئەم پێشەوایە مەزنەدا ئاهەنگ بگێڕێ، خواردن‌و شیرینی ببەخشێ، بیکا بە ڕۆژێکی پڕ لە شادی، هەروا لەو ڕوژە پیرۆزانەدا پێویستە زیاتر لە ژیان‌و بەسەر هاتەکانی بگەین، بە مەلەوانی کردن خۆمان نقومی دەریای قوڵی ژیان‌و ڕێبازەکەی بکەین‌و دووڕو مرواری بەدەست بێنین، لە کانیاوی بە خێرو پڕ بەرەکەتی ئایینی پیرۆزی بخۆینەوە، بەڵام بە شێوەیەکی شەرعیانەو لە بازنەو یاد کردنەوەیەکی ڕەوا بەڕێوە ببرێ، بۆ ئەم مەبەستەش، من زۆر لە مێژ بوو دەمویست بە کورتی‌و بە زمانی شیرینی کوردی، بە پاڵپشتی چەند سەرچاوەیەکی بڕوا پێکراوو بێگومان، بە هۆنراوە لە ژیان‌و بەسەرهاتەکانی بنووسم، بە شێوازێکی تازە لەگەڵ سەردەمی ئیمڕۆ بگونجێ‌و سوود بەخش بێت.

پشت بە خوا توانیم ئەم هۆنراوەیە بەرهەم بێنم بە هیوای ئەوەی ببێتە ڕێگایەك بۆ تێگەیشتن‌و پێگەیشتن‌و جێگای خۆی بکاتەوە لە دڵی خوێنەرو گوێگرانی خۆشەویستی کورد زوباندا.

**دانەر**

**محسن أحمد مصطفى**

**گوندی بەحرکە**

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

فەرموون لەگەڵ کورتەی ژیاننامەی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) وگرنگترین رووداوو بەسەرهاتەکانی ژیانی. (بە هۆنراوە) بە ئومێدی ئەوەی لای خوێنەری خۆشەویستی کوردزمان جێگەی خۆی بگرێتو لە کۆڕەکانی مەولوودنامەی پێغەمبەر (ﷺ)دا بخوێندرێتەوە.



## ۞باسی لە دایک بوونی پێغەمبەر۞

موسـلمانینە لـە هـەموو سـالێ   بـا بێتـە جـەژن لـە هـەموو ماڵـێ
بە بونەی بوونی. گەورەو مەبەستمان   واتـە (محمـد) پیشـەوای گشـتمان
کوببینـەوە. ببـین بـە بـرا   خـێری چاك بكـەین چـەند بۆمـان كـرا
بیروباوەڕمـان تازەکەینـەوە   هانـا هـەر تـەنیا بـۆ خـوا بەینـەوە
بەشیعری خـۆش و بـە وتـاری جـوان   سـەلەوات لێـدەن بـە دڵ و زوبـان
بۆ یـەکتر بـاس کـەن چۆن هاتـە جیهان   چۆن بـوو بـە رابـەر لـە لایـەن یـەزدان
بـۆ وەی هـەموو کـەس زۆر بـاش تێبگـا   چۆنـی دامـەزراند لـە بۆمـە رێگـا
کاتـێ کـە خـودا بـۆ ئێمـە ویسـتی   والا کاتـەوە دەرگـای خۆشـبەختیی
خسـتیە نـاو دڵـی (عبـدالله)ی بـاوکی   خوازبێـنی کردنـی، ئامینـەی دایکـی
گەوهـەری زاتـی پاشـی گواسـتنەوە   جێگیر بـوو لـە لای بـەڵێ لـەم شـەوە
(عبدالله) لـە دوارێگـای شـام دەگـرێ   بـۆ بازرگـانی لـە رێگـا دەمـرێ
پاش مردنـی بـاوکی، رەبیعـی یەکـەم   (أحمد) پـەیدا بـوو (١٢) بـوو دووشـەم
واتـە ئامینـە داینـا ئـەو زاتـە   دڵـی زۆر خـۆش بـوو کـەدی ئەوکاتـە
(عبدالمطلـب) مەلۆتکەکـەی بـرد   بـەرەو کابـە چـوو تـەواف پـێ کـرد
لـە دوایـی حەوتـەش، نـاوی بـۆ دانـا   واتـە (محمـد) سـەروەری دانـا
سـەلەوات لێـدەن لەسـەر پێشـەوا   واتـە (محمـد) پێغەمبـەری خـوا

## ✿بە دایەن دانی (محمد) و مردنی دایکی✿

لە لای (ثوویبة) شیری پێ دەدرا		پاشان (حلیمە)ی بە دایەن دانرا
بردی بۆ لادێ لای بوو ئەو ماوە		لە پاشی پێنج ساڵ ڕەوان کراوە
لە بۆ دیدەنی، خاڵانی باوکی		بۆ مەدینەی برد لە دوایی دایکی
بۆ ماوەی مانگێ ماوە لە لایان		موگری ببوون هەموو منداڵان
لای مەدینەییان خودا وای دەویست		هەر لەو ڕۆژەوە ببێتە خۆشەویست
لە گەڕانەوە، دایکی لە ڕێگا		مەرگ ڕێگای گرت، نەگەشتە جێگا
لەگەڵ خۆی هێنای لە دوا بەڕەکە		تاکو گەیاندی بە شاری مەککە
بردی بۆ لای خۆی لەو کات باپیری		بەخێوی بکاو نازی ڕاگری
بەڵام تەمەنی، گەییە هەشت ساڵی		باپیریشی مرد تێک چووە حاڵی
لە دوایی (أبوطالب)ی مامی		بردی بۆ لای خۆی تابێ ئارامی
حوا وای دانا بوو لای بوو بە شوان		تا باش بزانێ، شوانیی موسڵمان
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا		واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## ✿چوونی پێغەمبەر بۆ شام✿

لە بۆ شام دەچێ هەر بە مناڵی		لەگەڵ مامی دا لە دوازدە ساڵی
بوحەیرەی ڕاهیب لێی ئەڕوانێ جوان		دوای پرسیار کردن جا دێتە دووان
دەڵێ ئەم کوڕە دڵی زۆر پاکە		دوا ڕۆژی هەیەو گەلێ ڕووناکە
بە مامی دەڵێ ئاگاداری بە		لە هەموو کاتێ زۆر خەم خواری بە
لەبۆ خەدیجەش بۆ بازرگانی		هەم بۆ شام دەچێ لەوێوە زانی
گەورەی قەشەی شام ناوی نسطورا		بە هاوڕێکەی وت واتە مەیسەرە
ئاگاداری بە. گەلێ لەم ناوە		لە داهاتوودا گەورەو بەناوە
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا		واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## ۞روخانی کابە بە لافاو و چاك كردنەوەی۞

کاتێ کە روخا، کابە بە لافاو ... (٣٥) ساڵ بوو ئەوەگەورەو بەناو
تیرەی قورەیشی. هەموویان پێکەوە ... لەگەڵ یەکتری چاکیان کردەوە
(حجر الأسود) بەلام چۆن دانرێ ... هەر یەك وای دەویست ناوێ دەربڕێ
شانازی دانان بەو ئەو ببرێ ... تاکو وای لێهات سەریان تێ ببڕی
هەر لەو کاتەدا (محمد) ئەمین ... هاتە ژوورەوە ئەو رۆژ یەکەمین
هەموویان شاد بوون کە هات خۆشەویست ... رازی بوون بە ئەو هەر چۆنێکی ویست
عەبایەك راخەن فەرمووی پێغەمبەر ... (حجر الأسود)دابنێن لەسەر
گەورەی هەر هۆزێك با سوچێ راگرێ ... بەرزی کەنەوە هەموو بەجارێ
ئەوانیش هەروا هەموو پێ هەستان ... بەرزیان کردەوە لە جێی خۆ وەستان
ئینجا ئەم زاتە، بە دەستی پاکی ... لە جێی خۆی دانا بوو بە رووناکی
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا ... واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## ۞خوا پەرستیی پێغەمبەر۞

ئەو پێغەمبەرەی گەورەو خاوەن پشت ... باوکی خۆی نەدی فێری کا رەوشت
نەخوێندەوار بوو زۆریش هەژار بوو ... لە ناو گەلێکی پیس و بەدکار بوو
بۆ خواپەرستی هەموو رەمەزان ... دەچوو بۆ حیرا بۆ زیکری یەزدان
بیری کردەوە لە بتی تاشراو ... دەبێ ئەمێنێ بچێتن لە ناو

# ۞سەرەتای دەست پێکردنی وەحی۞

من لە ئەشکەوت بووم فەرمووی پێغەمبەر / بە چاو نووستبووم بە دڵ بە خەبەر
فریشتەیەک هات ئادەمی وێنە / پێی وتم (إقرأ) واتە بخوێنە
وەڵامم داوە، نەخوێندەوارم / ئەویش گوشیمی زۆر دای ئازارم
بۆ جاری دووەم دیسان ئەوجارە / پێی وتم (إقرأ) منیش دووبارە
خوێندەوار نیمە وتم لە وەڵام / هەروا گوشیمی ئینجا بەری دام
سێیەمیش هەروا داوای کرد دیسان / لە بۆی بخوێنم منیش لە ترسان
ئەوەک پێم بگا، دیسان باوەشی / هێزم ببڕێ هەروا بمگوشی
هیچ چارەم نەما زوو بە زوو هەڵسام / چاوم کردەوە گەلێ ئەترسام
بیرم کردەوە حاڵم گۆڕاوە / کتێبێک لە ناو سینگم نووسراوە
ئینجا لە ئەشکەوت ئەو دەم هاتمە دەر / لەبۆ چۆڵیان ڕێگام گرتە بەر
لەبەر خۆ ئەموت لەخەو بانگ کراوم / فریشتەی جاران هاتە بەر چاوم
رووی خۆم وەرگێڕا بۆ هەر لا ئیتر / دەهات بۆ ئەولا لێم نابوو بزر
بە منی ئەوت پێغەمبەری خوا / بۆ لای ئادەمی پێت بێنن بڕوا
سامم زۆر لێ نیشت چومەوە بۆ ماڵ / لە دوای داپۆشین هەستام بە هەر حاڵ
هەرشتێ دیبووم لە سەرەتاوە / لەبۆ (خدیجە) هەمووم گێڕاوە
لەو کاتە حاڵم وەک بەک گۆڕابێ / دەترسام دەستم لێ وەشێنرابێ
(خدیجە)ش وتی خراپ مەڕوانە / خوا شێتت ناکا کردەوەت جوانە
بەڵام زانینی راستی مەراقە / لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای وەرەقە
ئامۆزاکەی بوو لە ئینجیل زانا / نیشانی بدا ئەهێنی مانا
ئینجا وەرەقە لێی کرد چەند پرسیار / پاش تێگەیشتن کردی ئاگادار
فەرمووی جبریلە هاتووە بۆ لات / بریا لاو بامە بژیامە ئەو کات
بە هەموو هێزم یارمەتیم بدای / لەو رۆژەوە کە، دەربەدەر دەکرای
بەڵام لەو رۆژە مردنی بۆ هات / بەچاوی ئەدی چی بوو بەسەرهات
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا / واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## ۞وەستانی وەحی و دەست پێکردنەوەی۞

مـــاوەی (٤٠) رۆژی بەســـــەردا دەروا
وەحـــی بـــۆ نـــەهات ئینجـــا لـــە دووا

فریشــتەی یەکــەم هــەر وەکــو جــاران
دەبینێتـــەوە دیســـان لـــە ترســـان

دەچێتــەوە مـــاڵ لـــە دوای داپۆشـــین
وەحـــی دێ هەســتێ لــە بــۆ بــانگی دیــن

بــڵاو کاتـــەوە رێگـــای راســـتی خـــوا
لـــە هـــەموو جێگـــا پـــێی بێنـــن بـــڕوا

## ۞بانگەوازی دین بە نهێنیی۞

مـاوەی سـێ سـاڵان هـەر بـە نـهێنیی
هـەردەم خـەریک بـوو بـە بـانگی دیـنی

بانگـەوازی دیـن زۆر بـە کـزی بـوو
خـودا پەرسـتیی هـەر بـە دزیـی بـوو

تـا سـەعدی (وەقـاص) جارێ لـە جـاران
خەریکی نوێـژ بـوو. لەگـەڵ چەند کەسان

چـەند بـت پەرسـتێک لـەو کاتـە بینیـان
بـە فشـە پـێ کـردن لەگـەڵیا دووان

دای لـە یـەکێکیان (سـەعد) دەست و بـرد
پێغەمبـەر زانـی فـەرمانی دەرکـرد

بـۆ رێـک خسـتنی کۆمـەڵی پەنـهان
چەند کەس بوون هەموویگەنجی نەوجەوان

لـە مـاڵی (ئەرقـەم) کۆدەبوونـەوە
بـۆ ئـەوەی ئـایین بـڵاو کەنـەوە

بـۆ هـێزی ئیسـلام لاوی گیـان فیـدا
چـەندی بـۆی بکـرێ دەبـێ هـەوڵ دا

## موسڵمانە یەکەمینەکان

(خدیجە) یەکەم کەس بوو لە ژنان　　زوو ئامادە بوو، بوو بە موسڵمان
هەم (ئەبو بەکر)، لە نێو پیاوان　　یەکەمین کەس بوو بڕی هێنا ئیمان
زەیدی (حارث)یش لە ئازاد کراوان　　ئیمانی هێنا هاتە ریزی وان
هەروەها (بیلال) لە نێو بەندەکان　　(ئیمامی عەلی) لە نێو منداڵان
لە دوای وان(سەعد)و (طلحة) هەم (عثمان)　　هەروا (زوبەیر) و هەم (عبدالرحمن)
لەگەڵ چەندی تر بە کۆمەڵ و تاك　　ئیمانیان هێنا بە دینی وا پاك
دوا بە دوای ئەوان مامیشی (حمزە)　　ئیمانی هێنا بەم دینە بەرزە
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا　　واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## بانگەوازی بە ئاشکرایی

جا ئایەتی ﴿فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ﴾　　هاتە خوار لەبۆی روو بەڕوو یەکسەر
بانگی دینی کرد زاتی بەوەفا　　بۆ ئەو مەبەستە چووە سەر سەفا
هەروا رایگەیاند، بوتان کەم بەیان　　من پێغەمبەرم پێم بێنن ئیمان
بە خودا دەمرن زیندووش دەبنەوە　　دوا رۆژیش هەیە هەروا ژینەوە
پاداشتتان دەبێ، بە گوێرەی کردار　　بۆ چاکە، چاکە، بۆ خراپەش: ئازار
جێتان بەهەشتەگەر بێبن بڕوا　　گەر نا دۆزەخە لە رۆژی دوا
جا (أبو لهب) زۆر بە تورەیی　　وەڵامی داوە نەیبوو شوورەیی
وتی (تبا لك) لە راست خۆشەویست　　بۆچیت بانگ کردوین بۆچیت ئێمە ویست
خودا بۆیە ناردی سورەتی (تبت)　　بۆ خۆی و ژنی چوون بوو بە عیبرەت
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا　　واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# ئازاردانی موسڵمانان

گەورانی مەککە زانیان مسوگەر
گەورەییان دەڕوا لەسەر پێغەمبەر

ناچار دەستیان کرد بە ئازار دانی
ئەوەی هەر بە خوێ، هەم هاوڕێکانی

(بیلال) یەکێک بوو، کە بوو بوو بڕیار
بە دەست (ئومەیە)ی بێ و تاوانبار

دەیهێنایە دەر لە گەرمی نیوەڕان
ئەیدا سەر سنگی، بەردی زۆر گران

بۆ ئەوەی لای بدا لە ڕێی سەربەستیی
بگەڕێتەوە بۆ بت پەرستیی

بەڵام لەو کاتە هەر دەیوت ئەحەد
باوەڕی پتەو بوو، بە ڕۆژی ئەبەد

تا (ئەبوبەکر) لێی هاتە پرسیار
تاوانی چییە بۆ ئەیدەن ئازار

(ئومەیە) گوتی گەر ئەتۆی چاری
لەمنی بکڕە، دەبێ ڕزگاری

جا هەر لەو کاتە هات بۆ هیمدادی
ئەو دەم کڕییەوە دای ڕێی ئازادیی

(عمار)یش لەگەڵ (یاسر)ی باوکی
زۆر ئازار دران هەروەها دایکی

ئەمو خوزەیمە ئەیانوو شەرم
هەر سینیان دەنا ناو زیخی گەرم

هەموو بیوەڕۆ، تا بن پەشیمان
بگەڕێنەوە سەر ڕێی بەدی وان

پێغەمبەر فەرمووی: بەرمەدەن ڕێتان
ئارامتان هەبێ بەهەشتە جێتان

لەژێر ئازاردا ئەو کات دایکی مرد
یەکەم شەهید بوو پلەی بەرزی برد

(خباب)یش هەروا بە دەست موشریکان
ئازاری زۆر دی ئەیمابوو ژیان

سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا
واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## کۆبوونەوەی قورەیش بۆ هەڵخەڵەتاندنی پێغەمبەر

گەورانی قورەیش کە دیتیان بە چاو
ئیسلام خەریکە دەردەکاتن ناو

بۆ ئەو مەبەستە هەموویان هەستان
بۆ کۆبوونەوە نەیانما گومان

ریگایان ناگرێ چەند بدرێ ئازار
مەگەر چەند شتێك بۆی بدەن بریار

جا ناردیان بە دوای وتیان ئامادەین
چیت لێمان دەوێ تا بۆت پەیدا کەین

گەورەبیت دەوێ لە ئێمە ئەگەر
ئەتکەین بە گەورە ئێمە مسوگەر

ئەگەر لە ئێمە ئەتەوێ سامان
ئامادە دەکەین ئێمە بە گشتمان

ئەگەر جنۆکە لێیان کردووی کار
بە ئێمە بڵێ تا بۆت بکەین چار

پێغەمبەر فەرمووی ئێوە چی دەڵێن
رێی راست بەرنادەم چەند بدەن بەڵێن

نەهاتووم بۆ وەی ماڵتان بخوازم
گەورەیی و سامان نییە نیازم

من پێغەمبەرم لە لایەن خوا
رەوان کراوم پێم بێنن بروا

گەر رێگا بگرن لە هەردوو دنیا
بە شادی دەژین بەبن دڵنیا

سەڵەوات لێدەن لەسەر پێشەوا
واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## یەکەم کۆچ کردنی هەندێ لە موسڵمانان بۆ حەبەشە

بەردەوام گشتیان برایانی دین
لەبەر ئەشکەنجە نەیانمابوو ژین

فەرمانی دەرکرد ئینجا پێغەمبەر
بۆ هاورێکانی هەندێك بچنە دەر

لە بۆ حەبەشە رێگای کرد دیار
بە بڕوای پتەو خۆیان کەن رزگار

جا لەو ماوەدا ئیمامی (عثمان)
هەروا (سوهەیل) و هەم (عبدالرحمن)

(أبو سلمه) هەرواش (زوبەیر)
لەگەڵ (موصعەب)دا، کوڕی (عومەیر)

هەروا چەندی تر لە پیاو و ژنان
رێیان گرتە بەر خاوەنی ئیمان

بەڵام نەچووە سەر، ژیانی هەندەران
کاری لێکردن بیری نیشتمان

لە دوایی (٣) مانگ هاتنەوە یەکسەر
بۆ لای پێغەمبەر رێیان گرتە بەر

## ئیسلام بوونی ئیمامی عومەر

هەر لەو ماوەدا ئیمامی (عمر) ئیمانی هێنا بە ئیسلام یەکسەر
بوون بە خاوەن هێز، بۆ کابە دەرچوون گەورەی قورەیشیان زۆر پێ تێکەچوون
بە هەر جۆرێکی بەدو بەدکردار هاتبا لە دەستیان ئەیاندان ئازار
بەڵام ئازاردان بە کەم رووانین نابتە بەرگری بانگەوازی دین
خوا پشتیوان بوو هەیان بوو بڕوا دەبوا سەرکەون بە هێز بن هەروا
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## هاتنی گەورەکانی قورەیش بۆ لای (أبو طالب)

قورەیش زانییان لە رێگای ئازار هەمووی بێ سوودە چەندی بکەن کار
جا کۆبوونەوە گشت گەورەکانیان لەو گەورانە بوو، یەک ئەبو سوفیان
بە (أبو طالب) گوتیان هەموویان هاتووین برازات نەبا ئابڕومان
بەخراپە دەدوێ لە راست بڕوامان دەیەوێ تێکدا رێگای رەوامان
گاڵتە دەکاتن بە عەقڵ و دینمان بە گومڕای دانان باب و باپیرمان
پیاوێکی چاک بەهاتووین لە بۆ لات وازمان لێ بێنێ، وابکە برازات
ئێمە چارەکەین لەبەرتۆ بەڵام دەستی لێ نادەین ئەمان وێ وەڵام
جا (أبو طالب) لەو کاتە رۆیین پێی وت واز بێنە بە زمانی شیرین
بەڵام پێغەمبەر بە دڵ و بە دەم بانگی خۆی دەکرد نەوەستا یەک دەم
بۆیە ناچار بوون هاتنەوە هەروا لەبۆ لای مامی، هەتا وا ئەڕوا
وتیان تۆ لامان جێی رێز گرتنی هەم بە شەرەف و خاوەن تەمەنی
لە بۆ لات هاتووین ئێمە بە نیازی (محمد)مان زوو بۆ بکەی رازی

ڕێگامان چیتر لێ نەشێوێنێ   بۆ خۆی دانیشێ وازمان لێ بێنێ
ئێمە ناچارین لە ئێستا بە دوا   ئازاری بدەین ئەگەر وا بڕوا
جا (أبو طالب) گۆڕا هەڵوێستی   لەگەڵ شەڕ نەبوو چونکە مەبەستی
لە لای ناخۆش بوو چۆن خۆشەویستی   دەستی بۆ درێژ کەن نەگرێ دەستی
بۆ ئەم مەبەستە ناردی بە شوێنی   ئامۆژگاری کرد بۆ وەی واز بێنی
ئەمەی کە بیست و مامی وا بینی   کاری کردە سەر دڵ و دەروونی
دەترسا لەوەی پشتگیری نەکات   کەسی تر نیە یارمەتی بدات
بەڵام هەرچۆن بێ وتی بە مامی   بەخوا کار دەکەم بە بەردەوامی
مامە: ڕۆژ دانێن لە دەستی ڕاستم   مانگیش لە چەپم نابێ بوەستم
هەتا ئەو ڕۆژەی خوا سەرم ئەخات   یان لە پێناویا من گیانم دەڕوات
ئینجا (محمد) بە دڵنیایی   بانگی خۆی دەکرد بۆ ڕۆژی دوایی
کە چاری نەکرا وتیان ئامادەین   (محمد) دەبەین گەنجێکی دەدەین
با بێتە کوڕت لە جیاتی ئەوی   ئێمە هەتا کەی سەر بکەین ئەوی؟
بەڵام مامی چۆن دەکا کاری کەم   وتی بۆ ئێوە کوڕتان بەخێو کەم!
برازام بدەم ئەمن بە ئێوە   بۆ وەی بیکوژن ئێوە لە جێوە
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا   واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## ۞کۆبوونەوەی قورەیش بۆ گەمارۆی ئابووریی۞

کوشتنی (محمد) زانییان ناچنە سەر     هەروا ناشتوانن بیکەن دەربەدەر

جا بە ناچاری گاورەکان هەستان     لە بۆ گەمارۆی ئابووری وەستان

بۆ وەی موسڵمان گشت ببن بێزار     لە لاپەڕەیەک دەریان کرد بڕیار

نەڕۆنە لایان نەفرۆشن پێیان     وازیان لێ بێنن، نەکڕن لێیان

بەنوو (هاشم)یش وەک خاوەن بڕوا     بەنوو (مطلب) ئەوانیش هەروا

ئەم ئابلۆقەیان وەک وان هات بەسەر     چونکە پشتگیر بوون لە بۆ پێغەمبەر

بە تەنیا ئەبوو (لهب)ی لێ دەرچێ     لەگەڵ بڕیار بوو ئەو لەبەر هیچێ

یەکەم پشتگیر بوو بۆ گەمارۆ دان     خزمی خۆی نەویست لەبەرریی بەدان

موسڵمان هەموو ماوەی سێ ساڵان     شپرزە ببوون لە هەموو ماڵان

کەوتنە تەنگانەو بێ دەرامەتیی     ژیانیان ئەمابوو لەبەر برسیەتی

سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا     واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# دووەم کۆچ کردنی موسڵمانان بۆ حەبەشە

لەبەر ئەشکەنجەو ژینی نالەبار  …  پێغەمبەر فەرمووی خۆتان کەن قوتار
هەرچەند ناخۆش بوو لە ماڵ چوونە دەر  …  بەڵام ناچار بوون رێیان گرتە بەر
لەبۆ حەبەشە بە زۆری رۆیین  …  بە دڵی پاك و رووناكی ئایین
ئینجا قورەیش لەو کات زانییان  …  لە دوویان ناردن لەو دەم دوو کەسیان
لە بۆ نەجاشی بردیان چەند دیاری  …  بۆ وەی لەگەڵیان نەکا هاوکاری
لە دوای گەیشتن کردیان وتووێژ  …  بەڵام نەچووە سەر هەیبوو چەند راوێژ
ویستی بێن بۆ لای گشت پەنا بەران  …  بۆچی گرتوویانە رێگای هەندەران
کە هاتن بۆ لای لێی کردن پرسیار  …  لەسەر چ دینن بۆم بکەن دیار
لە رێگای خۆتان بۆچی لاو داوە  …  بۆچی راو کردووە لەبۆ ئەم ناوە
(جعفر)ی کوری ئەبو (طالب)ی  …  وەڵامی داوە زۆر بە ئەدەبیی
وتی ئەی پاشا بتمان دەپەرست  …  کرداری جوانمان نەدەهات لە دەست
یەکترمان ناویست ئابووین بە برا  …  لە ناومان هەبوو چەند شەڕ و هەرا
پێغەمبەرێك هات ناوی (محمد)  …  رزگاری کردین لە گشت کاری بەد
ئێستا رێمانە خودا پەرستیی  …  یاسا قورئانە هەروا بۆ راستیی
ئەمەیان زانی کە گەل و هۆزمان  …  زۆریان ئازاردایین تا بین پەشیمان
پەنامان هێنا تا ببین رزگار  …  لە سێبەری تۆ دوور بین لە ئازار
هەروەها وتی کەمێك لە قورئان  …  لە بۆ راستیتان بخوێنە بۆمان
خوێندیەوە سورەی (مریم) بە سەریا  …  تا ئایەی ﴿يَومَ أُبعَثُ حَيًّا﴾
لەگەڵ قەشەکان لەدوای خوێندنەوە  …  هەموویان وتیان، پاش بیر کردنەوە
ئەم فەرمودەیە لەیەك سەرچاوە  …  کەوا ئینجیلی عیسای هێناوە
جا بریاری دا، ژینیان بەرنە سەر  …  تا لە لای وی بن دوور بن لە زەرەر
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا  …  واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆی ئابووریی

گەورەی قورەیشیان پێنجییان هەستان
بەرامبەر بەمە بە توندی وەستان

(هیشام) و (مُطْعَم) لەگەڵ (زبیر)ی
هەروەها (زمعە)و (أبو البحتری)

وتیان با بەس بێت کاری ناڕەوا
بەنو (هاشم) و (مطلب) بۆوا

لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاردا بژیین
بۆ ئەیان بێ ژین؟ بۆ بیانکوژین؟

جا داوایان کرد بشکێنن پەیمان
ئەم ئابلۆقەیە لابەن لەسەریان

بە تەنیا (أبو جهل) نیازی
لەگەڵ نەشکان بوو پێی نەبوو رازی

(مطعم) گوێی نەدا ئابلۆقەی شکاند
لاپەڕەی بڕیار لە پێشیان دڕاند

ئەم هەواڵەی بیست یەکسەر پێغەمبەر
بۆ موسڵمانان رایگەیاند خەبەر

سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا
واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## هاتنی چەند کەسێکی حەبەشی بۆ لای پێغەمبەر

هەر لەو ماوەدا رێیان گرتە بەر
(٢٠) کەس حەبەشیی بۆ لای پێغەمبەر

بوو بە هاوڕێیان هەروەها (جعفر)
رەوانیان کردن تا ببن خەبەر

خۆی و کرداری ببینن بە چاو
بزانن وایە وەك دەیهێنن ناو

بەراورد بکەن وەسف و پێناسی
لەگەڵ کتێبیان هاتووە باسی

لە لای پێغەمبەر ئینجا هەموویان
گەلێ بە وردی گوێیان دا قورئان

کاری لێکردن بە دڵ و بە گیان
باوەڕیان هێنا بوونە موسڵمان

(أبو جهل) هات بەرەو رووی ئەوان
وتی نەمدیوە وەك ئێوە نەزان

بۆ هەواڵ زانین گشت رەوان کران
ئێوە چۆن وا زوو پێو هێنا ئیمان

وەڵامیان داوە بە دڵێکی پاك
ئێمەو کردەوەن خراپ بێ یا چاك

ئێوەش هەروەها گشت کردەوەتان
لەبۆ خۆتان بێ‌بێ درێژە پێدان

## چوونی پێغەمبەر بۆ (طائف)

پێغەمبەر زانی قورەیش گشتیان
دڵیان زۆر ڕەقە پێی نایەن ئیمان
ئینجا لەو ماوە ڕێگای گرتە بەر
لەبۆ (طائف) چوو سەییدی سەروەر
ڕێیان نیشان داببن بە ئیسلام
بەڵام زۆر بەدبوون نەیاندا وەڵام
بۆ هەر لا ڕۆیی ڕیزیان ڕانەگرت
لە هەموو لایان، بەردیان تێدەگرت
گەڕاوە مەککە، بە دڵی شکاو
بەڵام دینی خوا دەبێ دەرکا ناو
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا
واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## شەوڕۆیی پێغەمبەر

ساڵی دوانزە بوو خۆشەویستمان
شەو ڕۆی بۆ کرا بۆ قودس وئاسمان
هەروا لەم شەوە میعراج رووی داوە
واتە بۆ ئاسمان ڕەوان کراوە
ئەو پێنج نوێژە، لەوێ دانراوە
لەبۆ هەمووومان وەك یەك ناسراوە
لە پێش ڕۆژهەڵات ئینجا گەڕاوە
چی بە چاو دیبووی هەمووی گێڕاوە
خاوەنی بڕوا زوو کردی بڕوا
لای سەیر نەبوو کردەوەی خوا
لە (بیت المقدس) لێیان کرد پرسیار
جیگا بە جێگا لە بۆی کردن دیار
چەند وشترێکە هەروەها پرسیان
بەرەو مەککە دێ بۆمان کە بەیان
وەڵامی داوە بەڵام بێ دینان
لەبەر ملهوڕیی دوور بوون لە ئیمان
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا
واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# ✿بانگەوازی پێغەمبەر بۆ هۆزەکان✿

لەبەر بەدکاری و خۆ بەزۆر زانین     قورەیش دوور بوون لە ڕێی بانگی دین
پێغەمبەر دەچوو بۆ ناو هۆزەکان     کاتی بازاڕی هەموو وەرزەکان
بانگی دەکردن تا بێنن ئیمان     هەندێ لە وەڵام ناشیرین دەدوان
لە مەدینەیان شەشی خەزرەجیی     وەڵامیان داوە جوان بوو ئامانجی
ئینجا پێغەمبەر کەمێ لە قورئان     لەبۆی خوێندنەوە گوێیان گرت گشتیان
دوای بیر کردنەوە بە بیریان داهات     وتەی جوولەکان لەگەڵ بەسەرهات
کە پێغەمبەرێك دێتن لەم ماوە     ئەمە خوێیەتی هەروەك وتراوە
ئامادە بوون، بۆ ئیمان پێ هێنان     بەڵام بە مەرجێك، پێیاندا پەیمان
گشت تیرەکانیان بە یەك بگەینێ     ئاشتیان کاتەوە شادیی دابێنێ
جا بۆ مەدینە ڕێیان گرتەبەر     بەسەرهات چی بوو پێیان دان خەبەر
هەر لەو کاتەدا بە زۆری لەوان     بڕوایان هێنا بوونە موسڵمان
لە ئەوس و خەزرەج بۆ لای پێغەمبەر     هاتن پاش ساڵێ هەموویان یەکسەر
لە عەقەبەدا پەیمانیان وا دا     هەر خودا بناسن کەسیان لا نەدا
دوای وان (٧٢) هاتن بەو حاڵە     لە کاتی حەجدا لە پاش ئەو ساڵە
لەگەڵیان دابوو هەروا دوو ئافرەت     هەموو ویستیان ببینن حەزرەت
پێغەمبەر فەرمووی زۆر بە نهێنیی     بچنە عەقەبە کەس نەیان بینێ
جا کە تێپەڕی سێ یەکی شەوێ     بۆ لایان ڕۆیی بیان بینن لەوێ
هەروا حازر بوو، مامیشی (عباس)     ویستی چەند شتێ بۆیان بکا باس
وتی (محمد) گەورەیە لامان     پارێزگاری کەین ئێمە هەموومان
بەڵام دەیەوێ لە لا مان بڕوا     بۆ لای ئێوە دێ پێی بێنن بڕوا
ئێوەش چی دەوێ لەو بانگەوازی     بۆی دابین بکەن هەموو نیازی
هەروەها دەبێ بیکەن پارێزی     لەڕاست ئەوانەی، کە لەو نین ڕازی

بــە تێکـــڕا وتیـــان ئێمـــە ئامـــادەین
هـەرچۆن بفـەرمووی خـاوەنی وادەیـن
بانگـەوازی کـــرد جـــا بــۆ لای خـــوا .
بـــۆ ڕێگـــا گرتـــن، ناســـینی هـــەروا
بـۆی دیـاری کـردن هـــەموو مەبەســـتی
بـۆ ڕوون کردنـەوە ڕێگـای سەربەسـتیی
کـــە درا بڕیـــار گشـــت پاڕانـــەوە
لـە خـودای گـەورە جـا گەڕانـەوە
ســەلەوات لێــدەن لەســـەر پێشـــەوا
واتـــە (محمـــد) پێغەمبـــەری خـــوا

## کۆچ کردنی موسڵمانان بۆ مەدینە

کــە بــوو د ڵنیــا، ئینجــا پێغەمبــەر
فـەرمانی دەرکرد لـە بۆ چوونـە دەر
بۆوەی کـۆچ بکـەن تـا بـبن ڕزگـار
بچنـە مەدینـە دوور بـن لـە ئـازار
کۆمـەڵ کۆمـەڵ و تـاك تـاك نـهێنی
کۆچیـان دەکرد و کـەس نـەیدەبینی
ئـەبو بـەکریش کـۆچ بکـا ویسـتی
وتـی ڕێـم بـدە بـە خۆشەویسـتی
وای زانـــی کـــاتی هـــاتووە بـــەڵام
ڕێگـای پـێ نـەدا لـەو دەم لـە وەڵام
فەرمووی تا یەکێك ڕێت لەگەڵ دەگری
بـبن بـە هـاوڕێ لەگـەڵ یـەکتری
بەمە دڵخۆش بوو، زۆر (ئـەبوو بـەکر)
زانـی هاوڕێکـە خۆیـتی پێغەمبـەر
ســەلەوات لێــدەن لەســـەر پێشـــەوا
واتـــە (محمـــد) پێغەمبـــەری خـــوا

## ۞کۆبوونەوەی قورەیش لە (دار الندوة)۞

قورەیش بینیان ئیسلام هەیتی هێز / لای مەدینەییان بووینە خاوەن ڕێز

لە (دار الندوة) گشت کۆبوونەوە / بۆ وەی چارێکی بۆ بدۆزنەوە

هەندێك دەیانویست بیکەن دەست بەسەر / هەندێکیش ویستیان بیکەن دەر بە دەر

جا (ابو جهل) ملهوڕی بەدکار / وتی بیکوژن گشت بووینە بێزار

بەڵام بەجۆرێك چ کەس نەتوانێ / تۆڵەی بستێنێ یەك لە خزمانێ

لەهەر تیرەیەك گەنجێك کەن دیار / تا لە کوشتنی گشت بن بەشدار

هەر کاتێك هات و جێبەجێ کرا / خوێنی پەرت ئەبێ لە ناومان تێکڕا

ئێمە ئامادەین لەپاش کوشتنی / بە زوویی هەرچەند ویستیان خوێنی

گشت پەسەندیان کرد هەستان بەم کارە / وتیان بەڕاستی ئەمەیە چارە

سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا / واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## ۞کۆچ کردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە۞

جبریل هاتە لای خۆشەویستمان / ئاگاداری کرد لە هەموو پیلان

مەککە جێ بێڵن بڕۆن بە یەکجار / بچنە مەدینە خۆ بکەن قوتار

پاشی نیوەڕۆ سەییدی سەروەر / (ئەبووبەکر)ی دی ڕێ بگرنە بەر

هەروەها ویستی بە شەو دەربچی / بەڵام شەو دوشمن بوو نە ئێشك چی

بۆ وەی نەیەڵن لە ماڵ بێتە دەر / لەگەڵ یەك لێی دەن بیکوژن یەکسەر

جا گوتیە عەلی لە جێی پاڵ داوە / بۆ وەی وا بزانن لە جێی خۆی ماوە

لەو کاتە دەرچوو لە خوا پاڕاوە / هەستیان پێ نەکرد کەسیان لەم ماوە

ڕێگای گرتە بەر بە خۆی و (صدیق) / بۆ ڕێی وا پیرۆزکردی بە ڕەفیق

ئینجا بەیانی زۆر بە نامەردیی      چوون بو ناو ماڵی بەڵام نەیاندی
زانیان ئەماوە خۆی کردووە رزگار      (أبو جهل) هات نەزانی زۆردار
لە دوویان دەرچوو بە خۆی و چەند سوار      هەتا غاری (ثور) رۆیین هەر بە غار
لەسەر دەرگای غار بە ئەمری یەزدان      دوو کۆتر هاتن دروستیان کرد لان
لەو دەم هێلکەیان لە ناوکرد هەروا      بۆوەی باوەڕ کەن هەر زوو بێ‌بڕوا
جاڵجاڵۆکەش هات دەرگای لێ تەنین      وەهای نیشاندان کەسیان لە ژوور نین
ئەمەیان بینی ئەیانما گومان      گشت گەڕانەوە بێ دین و ئیمان
رابەری رێیان (عبدالله)ی (أرقط)      لە دوای سێ رۆژ هات لەبۆ لای حەزرەت
ئینجا لەگەڵ یەك لە لای کەنار      رێیان گرتە بەر تا ئەبن دیار
ماوەی هەشت رۆژان رۆیین بە رێگا      جا گەییە قەبا دیاری کرد جێگا
مزگەوتی یەکەم لەو شوێن دامەزرا      خۆشی کاری کرد تا تەواو کرا
رێگای گرتەوە لەبۆ شاری جوان      واتە مەدینە شاری پشتیوان
لەبۆ هاتنیی ببوون چاوەڕوان      هەر کەسێك دەیویست لەو ببێ میوان
پێغەمبەر فەرمووی لەهەر جێ وشتر      ویستی یەخ ببێ ئەو جێیە ئیتر
دەبێتە جێگام بۆ میوانداری      بۆ جێگای تایبەت ئەبوو بڕیاری
وشترەکە یەخ بوو لە گۆڕەپانێك      هی دوو یەتیم بوو جێگایەکی رێك
بەرامبەر ماڵی (أبو أیوب)ی      تەقدیر وەها بوو لەو میوان ببێ
هەر لەو کاتەدا ئەو شوێنە دەکرێ      ویستی لەو جێیە مزگەوتێك بکرێ
لەبۆ ئەم شارە ناوی دین. دانا      لە جیاتی یەسریب مەدینەی ناونا
ئینجا کە دیتی هەیە لەم شارە      چەند تیرەی نارێك زوو کردی چارە
(مهاجر) لەگەڵ (أنصار) بوون بە برا      ئاڵای ئازادی ئیسلام هەڵکرا
هەروا رێك کەوتن لەگەڵ جووەکان      ناکۆکییان نەبێ بەستیان وا پەیمان
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا      واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# شەڕی بەدر

قورەیشی. هەردەم لە ڕێگای شایین — کۆسپی سەخت بوون لەبەر نەزانین
زانی پێغەمبەر: کە ئەبوو سوفیان — بە ڕێگایەوە لەگەڵ بازرگان
بۆ ڕێ لێگرتن دەری کرد بڕیار — دەست گیریان بکەن بیاندەن ئازار
بە خۆی و چەند کەس لە ئیمانداران — چوون ڕێیان بگرن نەیاندەن ئەمان
جا ئەبوو سوفیان کە زانی خەبەر — پیاویکی هەنارد بۆ مەککە یەکسەر
بێن بە هاواری ڕزگار کەن کاروان — نەوەک دەست گیرکەن گشت ماڵ و سامان
هەر لەو کاتەدا گرتی ڕێگای تر — بۆ گەڕانەوە تا بێن بزر
گەورەی قورەیشی کە پێیان زانی — هەموویان هاتن بۆ پشتیوانی
(٩٥٠) کەس بوون بە ژمار — لە سوار وشترو لە ئەسپ سوار
بەڵام موسڵمان سێ سەد و چواردە — بۆ ئەو مەبەستە بیوون ئامادە
لای ئاوی بەدر هەموویان دابەزین — جا خۆشەویستمان (محمد) ئەمین
دەستی بڵند کرد لە خوا پاڕاوە — تێکیان بشکێنە پەیمانت داوە
ئینجا لەو کاتە (١٧)ی ڕەمەزان — شەڕ دەستی پێکرد لە هەردوو لایان
بە تیر تێک گرتن هەم بەشیر وەشان — چاوچاوی نادی گەرم بوو مەیدان
شێرانی دلێر خاوەنی ئیمان — بوو بە پشت گیریان فریشتەی یەزدان
هەروا لەم ڕۆژە خۆشی خۆشەویست — ئازایی دەرخست پتر لە پێویست
شەڕ کۆتایی هات شکان دوژمنان — (٧٠) بوون بەدیل (٧٠)شیان کوژران
لە موسڵمانان (١٤) پاڵەوان — بوو بە قوربانی ڕاستی ڕێی قورئان
لە ڕێگای ڕاست بێ خاوەنی بڕوا — دەبێ سەرکەوێ پشتیوانە خوا
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا — واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# ۞شەری نوحد۞

قورەیش ویستیان لە تۆڵەی بەدر — سەرکەوتن بینن لە شەڕێکی تر

کۆیان کردەوە ئینجا بەدکاران — سێ هەزار تەواو لە تاوانباران

زۆر بە دروستی ڕێکیان خست هێزیان — ئەبوو سوفیان بوو سەرکردەی گشتیان

لەبۆ بەرگری پەیویست چوونە دەر — لە جێگای خۆیان دەست بکەن بە شەڕ

بەڵام هەندێکیان نەبوون حازر — لەشەڕی بەدر ببوونە ئاگر

سەریان گەرم بوو تایبەت گەنجەکان — وایان دەزانی دوورن لە شکان

دڵی نەشکاندن بەڵام خۆشەویست — لەبۆ چوونە دەر هەرچەند نەیدەویست

خۆی و(٧٠٠) کەس ڕێیان گرتە بەر — لەبۆ نوحد بە (الله أكبر)

لەسەری چیا تیرهاوێژ دانران — خۆیان قایم کرد بوونە پشتیوان

شەڕ دەستی پێکرد گەرم بوو مەیدان — بە تیرو بە ڕم، هەم بە شیر وەشان

لەسەرەتاوە خاوەنی بڕوا — سەرکەوتوو بوون بەڵام لە دوا

تیر هاوێژەکان جێی خۆیان بەردا — تالان کردنیان کە هات بە بیردا

ئەمەیان زانی خوا نەناسەکان — خالید ناودار، یەکێ بوو لەوان

ئەو کاتە نەیبوو بڕوا بە قورئان — لەبۆیان سوورا بوون نەیاندان ئەمان

لە پێش و لە پاش هاتن لە بۆیان — زۆر شپرزە بوون خاوەنی ئیمان

پێغەمبەر خۆشی ببوو بریندار — هەرچەند هاوڕێیان کردیان پارێزگار

شەهید بوو لێیان (٧٠) پاڵەوان — حەزرەتی هەمزەش یەکێ بوو لەوان

ئەمە دەرسێك بوو نابێ موسڵمان — لە ڕێگا لادەن بشکێنن فەرمان

پاشان برایان لەبەر تێشکان — لە لای عەرەب و هەموو جوولەکان

زۆر بە بێ هێزی دەهاتنە بەرچاو — جا بەنوو نەزیر جوولەکەی بەدناو

بەهەڵیان زانی کە بێ هێز ماوە — وتیان دەیکوژین ئێمە لەم ماوە

بەڵام کە ئەمەی زانی پێغەمبەر — زوو دەری کردن بۆ شام و خەیبەر

سەڵەوات لێدەن لەسەر پێشەوا — واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# ۞شەری خەندەك۞

پاش شەڕی ئوحد قورەیشی ویستیان      ئیسلام نەهێلن لەناو بە گشتیان
جولەکەش هەروا لەبەر بەدکاریی      دەستیان درێژ کرد لە بۆ هاوکاری
هەروا چەند تیرە بوونە یاریدەر      هاتن بەشدار بوون ئەوانیش بۆ شەڕ
کۆیان کردەوە هێزێکی گەورە      نزیك دە هەزار بۆ ئەم لەشکرە
ئینجا پێغەمبەر لەو کاتە بیستی      لە مەدینە بێن دەرنەچن ویستی
لەسەر راوێژی هاوڕێی خۆی سەلمان      خەندەك لێدرا لە هەموو لایان
هەروا بۆ ناوچەی دەرەوەی شاری      شوورە دامەزرا وا بوو بڕیاری
رێیان گرتە بەر ئینجا بێ دیفان      بەرەو رووی وان هاتن دامەزران
ماوەی بیست رۆژی هەر شەڕە تیر بوو      شەڕی نێوانیان بەڕاستی تیر بوو
ئەوەی موسڵمان پێی بوون شپرزە      جوولەکەی ناویان بەنو قورەیزە
دڵ پیس و ناپاك شکاندیان پەیمان      ببوون بە پشتگیر لەبۆ قورەیشیان
لە پاش و لە پێش لێیان دەترسان      مەترسیان زۆر بوو بۆ خاوەن ئیمان
درێژەی کێشا ماوەی ئابلۆقە      گاور پێی تێکچوون کەم بوو ئازوقە
گشت خێوەتی خست رەشەبایەك هات      زۆربەی زۆری کوشت لە مەڕو مالات
کەدییان ئەم حاڵە زانیان ئەما چار      گەڕانەوە ماڵ هەموو بەیەکجار
جا رزگاریان بوو خاوەن باوەڕان      ئەما مەترسی هێزی گاوران
جوولەکەی بەنو ئەزیر کە شکان      سەریان شۆڕ ببوو هەیان بوو تاوان
جا خۆشەویستمان دەری کرد فەرمان      لەناویان بەرن ئەیان دەن ئەمان
لێیان هاتنە دەست زۆریان لێکوژرا      مەڕ و مالاتیان گشت دابەش کرا
ئێمەش گەر یەك بین پشت بە خودا بەستین      لە رێگای ئایین بە کارمان هەستین
دەبین بە ئاگر دەبین بە پۆڵا      رووبەڕووی دوشمن دەبین لە هەر لا
زۆردار ناتوانن دەستمان بۆ بێنن      پەنجەی پیرۆزمان چاوی دەردێنن
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا      واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# ۞ڕێککەوتنی حودەیبیە۞

سالّی شەشەمی کوچی پێغەمبەر     لەگەلّ کومەلێك، ڕێگای گرتەبەر

بەرەو مەککە چوو بەنییەتی عەمرە     قورەیشی بینیان ئەو هێرە گەورە

هەزارو چوارسەد ئیسلامیی ناودار     بو چوونە ژووریان ئەیاندا بڕیار

جا لە حودەیبیە گفتوگو کرا     بڕیاریان لەسەر چەند خال دامەزرا

یەکەم زیارەتی ئەمسالّ دوا خرا     بو سالێکی تر ڕێگای پێدرا

سێیەم هەرکەسێ بێت بە موسلّمان     ڕەوان کرێتەوە دەبێ لەبو وان

چوارەمین پەیمان ئەو کەسەی کەوا     لە ئیسلام دەرچێ نەیمێنێ بڕوا

هات لەبو لای وان بیدەنێ جێگا     لەسەریان نەبێ لێی بگرن ڕێگا

پێنجەم بو هەرلا پەیمان ڕەوا بێ     لەگەلّ عەرەبدا وەك یەکتر وابێ

شەشەم لە نێوان هاوڕێی هەرکامیان     ئەگەر شەڕ رویدا ئەچنە هاواریان

ئەم ڕێك کەوتنە لەو کاتەدا بەسترا     زور بە کەلك بوو پێغەمبەر ناسرا

لەلای قورەیش و هەموو تیرەکان     بو بانگ کردنیان لە بو ڕێی یەزدان

بو ناوە خویان بوو بەهێمنی     لەبو دەرەوەش نوانی ڕاگەینی

نامەی ئایینی لە بو پاشاکان     بو ڕێگا گرتن پێی بێن ئیمان

واتە هەرقەل و نەجاشی و کیسرا     لە بو زوری تر هەم ڕەوان کرا

سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا     واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## شەری خەیبەر

لەسالی حەوتەم ویستی پێغەمبەر لەشکر رێك خا، بگرێتن خەیبەر
بە توند و تیژی هێرشی بۆ بردن بەماوەیەکی کەم لە ناوی بردن
گشت قەلاکانیان یەك بە یەك رووخان هێزیان لێبردن خاوەنی ئیمان
هەر لەو کاتەدا دەری کرد بڕیار لە جێگای خۆ بێ پیس و بەدکردار
بەمەرجێ نیوەی بەرهەمی زەوییان لەبۆ ئیسلام بێ شۆر بکەن سەریان

## هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنی حودەیبیە لە لایەن قورەیش

بەنوو بەکری تیرێك بوون زۆردار لەگەڵ قورەیش بیوونە هاوکار
تیرەی خوزاعەش هەیانبوو پەیمان پشتیان بەستبوو بە خاوەن ئیمان
لەبەنوو بەکری، یەك خراپ دوا لە راست پێغەمبەر، پێی بەنوو سروا
یەکێ خوزاعەیش خێرا هاتە دەم بەبێ راوەستان لێیدا هەر ئەو دەم
جا بەنوو بەکری لە بۆ چوونە سەر تیری خوزاعە رێیان گرتە بەر
چونکە لە پێشان دوشمنی یەك بوون بەکتریان ناویست هەردەم سارێك بوون
قورەیشی بە دزی بوونە پشتیوان بووەی نەزانن کاری بەدی وان
لە خوزاعەییان (٢٠) پتر کوژرا ئەو کاتەی کە بەسەریان دا درا
بەلام قورەیشی لە دوایی رووداو لەبەر رێك کەوتن زۆر بیوون تەنگاو
هات ئەبوو سوفیان بۆ لای پێغەمبەر بۆوەی بزانێ چی هەیە خەبەر
ئەم رێك کەوتنەی کە بەستراوە وەکو خۆی ماوە؟ یان هەڵوەشاوە
وتی من هاتووم لە بۆ لای ئێوە رێك کەوتنەکەمان نوێ ببێتەوە
پێغەمبەر فەرمووی ماوەی زۆر ماوە بۆنوێ ببێتەوە، بۆ چ قەوماوە؟
جا ئەبوو سوفیان زانی زانراوە پەیمان شکاوە ئەو دەم گەڕاوە
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# گیرانی مەککە

رێك کەوتنێ لە حودەیبیە بەسترا
لە لای قورەیشیان کە هەلوەشیرا

پێغەمبەر ویستی بۆ مەککە بچێ
بچێتە ناوی و کەسیش تێ نەچێ

خۆی و دە هەزار رۆیین بە رێگا
لە (مر الظهران) گرتیان جێگا

ئەبوو سوفیان لە، مەککە هاتە دەر
بۆ وەی بزانێ چی هەیە خەبەر

لەو کاتە بینی ئاگرێك دیارە
تێگەیی قەوما، نەیماوە چارە

هەر لەو ماوەدا (عباس)ی نـاودار
ویستی قورەیش بکا ئاگادار

لەدوای دەرچوونی لەو دەرو دەشتە
دی (ئەبوو سوفیان) لەو دەرو پشتە

بۆ لای (محمد) بە ئامۆژگاری
ویستی رێی بگرێ تا بێ رزگاری

کوشتار روونەدا بێن دەربەدەر
بەمە رازی بوو رێگای گرتە بەر

لە دوای هاتنی لە رۆژی دوا
گفتوگۆ کرا پێی هێنا بڕوا

بۆ ئەبوو سوفیان هەروەها ویستی
رێزێکی هەبێ لای خۆشەویستی

لەبۆ قورەیش چونکە سەرۆك بوو
بەخۆی دەنازی لە لایان کۆك بوو

جا فەرمووی هەر کەس بچێتە مالّی
یا بچێتە کابە باش دەبێ حالّی

مەککەیش هەموو وایان دا بڕیار
شەڕیان لەگەلّ کەن تا بێن قوتار

ئەبوو سوفیانیش گەڕاوە بە تاو
وتی لە بۆ شەڕ ناوێن یەك هەنگاو

(محمد)ە هات ئێوە قورەیشیان
بەخۆی و هێزی نەیێننە پێشیان

لە مالّی من بێ وتی گەر هەرکەس
یا لە کابە بێ نایێ هیچ ترس

خۆیان شاردەوە زۆر لە پیاوان
لەو شوێنانەداو لە جێگای پەنهان

کام خاوەن هێز بوو خاوەنی ناز بوو
لەو دەم دەلەرزی کز و لاواز بوو

جا لە (کەدا)دا سەییدی سەروەر
هاتە ناو مەککە بێ شەڕ و زەرەر

لە لایی (کودا)ش خالید لەبۆی هات
تاریکی نەمابووەبوو بە رۆژهەلّات

لەم ناوەی نەهێشت زولّم زۆرداریی
هەمووی داخرا ڕێی نالەباریی

پێغەمبەر بە خوی بتی ڕیز کراو ... لە دەوری کابە هەمووی برد لە ناو
عوززاو چەندی تر هەروا لەم ماوە ... هەمووی شکاندن خرانە دواوە
هەر لەو کاتەدا بە خۆی خۆشەویست ... لە بۆی دەربڕین چەند یاسای پێویست
ئیسلام هاتووە بۆ مرۆڤ، گشتی ... هەردەم دوورە لە، ڕەگەز پەرستیی
هیچی تر نابێ خۆ بە زۆر زانین ... ئادەم لە خۆڵە، ئێوەش ئادەمین
ئینجا بێ سزا لە کاتی گەرمی ... لە گشتیان خۆش بوو لە بەر دڵ نەرمی
تەنیا چەند کەسێك بۆ دوشمن داری ... وەکو جاران بوون لەبەر بەدکاریی
فەرمانی دەرکرد لە ناو بردران ... هەندێکیش هاتن بوونە موسڵمان
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا ... واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

## حەججی ماڵ ئاوایی

لە ساڵی دەیەم دەری کرد بڕیار ... لەبۆ حەج ڕۆیی خۆی و دەهەزار
ئەم حەججە ناونرا بە ماڵئاوایی ... هیچی تر نەچوو چونکە لە دوایی
لە عەرەفەدا خوتبەی لە بۆ دان ... مافی مرۆڤی بۆ کردن بەیان
فەرمووی خوێنی یەك، نابێ بڕێژن ... پاش ملەی یەکتر خراپە مەبێژن
ماڵی یەك نەخۆن بە دزی و زۆرداری ... هەموو دەم دوور بن لە خراپەکاری
داوێن پیس نەبن لەگەڵ یەکتری ... دەبێ موسڵمان ڕێگای ڕاست بگری
لەسەر ئێوەیە ئافرەتیش مافیان ... بۆیان ئەنجام دەن ڕەفتاری جوان
لەگەڵ یەکتری هەموو یەکسانین ... بەڕێز لای خودا بگرێ ڕێی ئایین
بۆتان جێ دێڵم حەدیس و قورئان ... یاسای ئێوەیە تا ماوە جیهان
سەری بڵند کرد لە خوا پاڕاوە ... خوایە چیت فەرموو کردم لەم ماوە
ئایەی ( الیومَ، أکملتُ)لەو کات ... هات بۆی خوێندنەوە لەو دەم پێش بڕوات
جا بەم ئایەتە فەرموودەی خوا ... کۆتایی پێ هات نەهات لە دوا
سەلەوات لێدەن لەسەر پێشەوا ... واتە (محمد) پێغەمبەری خوا

# ﴿کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ﴾

دوای حەج کردنی ئینجا گەڕاوە    ئەبۆ مەدینە بەڵام لەم ماوە
نەخۆشی تووش بوو زۆری دا ئازار    موسڵمان تێکڕا بۆی بوون خەمبار
بەڵام هەرچۆن بێ لە بۆ مزگەوت    هات و چوی دەکرد تا لە پێ کەوت
خاوەنی ئیمان کە ئەمەیان بیست    زانییان دەڕوا لایان خۆشەویست
هەموویان تێکچوون پەشۆکان گشتیان    دڵیان تەنگ بوو لە بۆی دەگریان
بەڵام کاری خوا دەبێ سەر گرێ    خۆشەویستی ویش دەبێ بمرێ
لە رۆژی (١٢) رەبیعی یەکەم    (١١)ی کۆچی بوو لە رۆژی دووشەم
ئەم دنیای داگرت لە ناو ئاوایی    (محمد) کردی کۆچی دوایی
ئەم خۆشەویستە هەموو مەبەستی    دەیویست دوور بین لە بت پەرستی
هەم لە کوشتن و ئارەق و قومار    لە دزی و دووڕوویی و کاری ناهەموار
درێغی نەکرد پێی هێنان بڕوا    دووری خستن لە کاری ناڕەوا
جیاوازی نەهێشت هەروا لە ناویان    هەژار و هەبووی دانا بە یەکسان
تەرازووی دادی لەو رۆژ هەڵواسی    هەموو چینێکی وەک یەک دەناسی
ماف دیار کرد لە بۆ ئافرەتان    بەرزی کردنەوە لە نزمی ژیان
چ کەسێک نابێ بە خوی بنازێ    مەزن کەسێکە خوا بێ نیازی
هەروا دایمەزراند بناغەی ئاشتیی    رێگای پیشاندایین لەبۆ زانستیی
لەبۆ مەی جێ هێشت حەدیس و قورئان    بوو بە یاسامان تا ماوە جیهان
ئەمە کورتێک بوو نووسیم بە وردی    بۆ یاد کردنەوە بە زمانی کوردی
دەپاڕێمەوە هەردەم لە خوا    لێمان خۆش بێ لە رۆژی دووا
لەگەڵ یەکتری ببێن بە برا    دوور بێن هەموو دەم لە شەڕ و هەرا
رزگارمان بکا لە دەستی زۆردار    چیتر نەبینین ژینی ناڵەبار
بمانپارێزێ هەردەم لە شەیتان    بەشادی بژین گشت لە کوردستان
جا لەبۆ یادی ئەم پێشەوایە    هەستن بووەستن جوان و رەوایە
بەدەم (فاتیحە)و سەڵەوات لێدان    بپاڕێنەوە روو بکەنە یەزدان
هەروا بۆ (محسن) بەندەی گوناهکار    داوا کەن لە خوا نەبێ شەرمەزار

# سەرچاوەکان

١- السيرة النبوية ـ لإبن هشام الأنصاري .

٢- فقه السيرة ـ محمد رمضان البوطي .

٣- مع الأنبياء ـ محمد عفيف طبارة .

٤- مەولوودنامەی نەوئەسەر شێخ (محمد)ی خاڵ .

٥- نور اليقين ـ محمد خضري بك .

## ناوەڕۆک

# مختصر سيرة الرسول ﷺ

## نظماً

محسن أحمد مصطفى



لە بڵاو کراوەکانی نووسینگەی تەفسیر / هەولێر